# SQL - ئۆراکڵ

# ORACLE

DATABASE




+ دابەزاندنی ئـــۆراکڵ
+ فێرکاری ئـــــۆراکڵ
+ دروستکردنی خشــتە
+ دروســتکردنی User
+ کــــــۆدەکانی SQL

ئامادەکردنی

سەرکەوت جمال محمد

زانکۆی سلێمانی 2017

j.sarkawt1992@gmail.com

پێشکەشە بە دۆستانی زانست

# ناوەڕۆك.......

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**( يرفع الله الذين أمنو منكم والذين أوتوا العلم درجات)**

**(سورة المجادلة:الاية 11)**

**In the name of Allah, the most gracious and the merciful**

**"Allah will raise up, to suitable ranks and degrees, those of you who believe and who have been granted knowledge"**

**(Al-mujadila: ayat 11)**

# پێشەکی:

سڵاو خوێنەرانی خۆشەویست سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە کە جارێکی تر دەرفەتی ئەوەی پێ بەخشیم کە بتوانم کتێبێکی تر بنووسم و پێشکەشی ئێوەی بەڕێزی بکەم هیوادارم خزمەتێکی بچوکی ئێوە بکات , وە هەقی خۆیەتی کە سوپاسی مامۆستای زۆر خۆشەویستم( م. پەیمان ) بکەم کە هاوکارم بوو لە فێربوونی ئەم بابەتەدا.

ئۆراکڵ یەکێکە لە بەرنامە بەهێزەکانی دروستکردنی داتابەیس,لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا بەکاردێت و کۆمپانیا گەورەکانی جیهان ئەم بەرنامەیە بەکاردێنن لەبەر بەهێزی پارستن ومتمانەی لە پاراستنی داتا و زانیارییەکاندا ئەم بەرنامەیە توانای لە خۆ گرتنی زانیاری زۆری هەیە هەر بۆیە لە بانك و شوێنە هەستیارەکاندا بەکاردەهێنرێت.

لەم کتێبەدا ( چۆنیەتی دابەزاندنی بەرنامەکە و دروستکردنی یوزەر و دروستکردنی خشتەو کۆدەکانی SQL ......هتد ) بە وردی و هەنگاو بە هەنگاو دروستکراوە و ڕونکراوەتەوە.

"هەمووکەسێك ئازادە لە بەکارهێنانەوەی ئەم کتێبە بەمەرجێك بۆ سودی گشتی بێت"

# چۆنیەتی دابەزاندی بەرنامەکە

سەرەتا دەبڵ کلیك لەسەر ئایکۆنی بەرنامەکە دەکەین






پاشان چاوەڕوان دەبین




پاشان Next دەکەین




پاشان Next دەکەین




پاشانNextدەکەین




لێرەدا پێویستە پاسۆرد بنووسین بە ئارەزوی خۆت,دواتر لەکاتی کردنەوەی بەرنامەکەدا بەم پاسۆردە بەرنامەکە ئەکرێتەوە لەبەر ئەوە بزانە چی ئەنوسیت تاوەکو بیرت نەچێتەوە, پاشان

دەکەینNext.




پاشان دەکەینNext



لێرەدا کۆتایی بە کردارەکە هاتوو بەرنامەکە چالاك بووە.

داتا بەیسی ئۆراکڵ چیە :

یەکێکە لەو داتا بەیسانەی کە لەزۆربەی ولآتانی ئەوروپاو کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهاندا پشتی پێدەبەستن بەتایبەتی لە بانك ودائیرە سەربازییەکاندا چونکە ئەم داتابەیسە توانایەکی باشی هەیە لە پاراستنی داتاو توانای خەزنکردنی زۆرە.

داتا بەیس چیە :

بریتی یەلەکۆمەڵێك زانیاری کەبەشێوەیەکی زانستی ڕێکخراون وە بەیەکەوە بەستراون لەڕێگەیەوە دەتوانین داتا خەزن بکەین وگیروگرفتەکانی ڕۆژانەی پێ چارەسەربکەین,هەر داتا بەیسێك لە تەیبلێك یان زیاتر پێك هاتووە.

تەیبڵ چیە :

بریتی یە لەوبەشە سەرەکیەی داتا بەیس کەداتای تیا خەزن دەکرێت هەر تەیبلێك لەدوو بەشی سەرەکی پێك . هاتووە(Column, Row)

Row:بریتی یە لەوبەشەی تەیبڵ کەبەشێوەیەکی ئاسۆی دەردەکەوێت,زانیاری دەربارەی کەسێك یان شوێنێك یان شتێك تیادا هەڵدەگیرێت.

Column:بریتی یە لەوبەشەی تەیبڵ کەبەشێوەیەکی شاوڵی( ستونی )دەردەکەوێت وە ناوی فێڵدەکانی تیادا دەنوسرێت وە بەچەند کۆڵۆمێك ڕۆیەك پێك دەهێنن.

تێبینی:لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەکەدا لە بەشێکی دا داوای نوسینی پاسۆرد دەکات,ئاگاداربە لە وەی چی پاسۆردێك دادەنێت چونکە دواتر بەو پاسۆردە بەرنامەکە دەکرێتەوە.

## چۆنیەتی چونە ناو بەرنامەی ئۆراكڵ

بۆ چونە ناوبەرنامەی ئۆراكڵ سەرەتا دەبڵ كلیك لەسەر ئایكۆنی بەرنامەكە دەكەین




لەبەشی Usernameدا دەنوسین System كە ئۆتۆماتیكی پرۆگرامەكە خۆی دای دەنێت.

لەبەشی Passwordدا ئەو پاسۆردە بنووسە کە لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەکەدا داوای کرد بینوسیت.



بەم جۆرە داغڵی بەرنامەکە دەبین.

یان بەرێگای دووەم کەبریتی یە لە کردنەوەی بەرنامەکە بەم شێوەیە




بە دەبڵ کلیك کردن لە...Run SQL Comma کە لەسەر شاشەکە دیارە یان لەهەرشوێنکی تربێت.

```
Run SQL Command Line

SQL*Plus: Release 10.2.0.1.0 - Production on Fri Dec 25 15:46:42 2015

Copyright (c) 1982, 2005, Oracle.  All rights reserved.

SQL> connect system/1992
Connected.
SQL> connect system/sys
ERROR:
ORA-01017: invalid username/password; logon denied

Warning: You are no longer connected to ORACLE.
SQL>
```

لەبەشی Usernameدا دەنوسین System کە ئۆتۆماتیکی پرۆگرامەکە خۆی دای دەنێت.

لەبەشی Passwordدا ئەو پاسۆردە بنووسە کە لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەکەدا داوای کرد بینوسیت.

دەبینین ئەگەر ڕاست بینوسیت ئاماژە بە کۆنێکت بوون دەکات وەك بەشی یەکەم وە ئەگەر هەڵە بێت ئاگادارت دەکاتەوە وەك لە بەشی دووەم دا دیارە.

## چۆنیەتی چونە دەرەوە لە بەرنامەی ئۆراکڵ

وەك لە لای چە پی وێنەکەوە دیارە کلیك لەسەر Logout دەکەین بۆ دەرچون لەبەرنامەکە

## چۆن پاسۆردی بەرنامەکە بگۆڕین

کلیك لەو سێگۆشە بچوکەی بەشیAdministrationدەکەین ئەم لیستە دەکرێتەوە

پێویستە کلیك لە Change my password بکەین و ئەم ڕوکارە دەکرێتەوە

Change My Password

127.0.0.1:8080/apex/f?p=4500:2615:8846591714793::NO:::

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Change My Password

Change Password Cancel Apply Changes

User Name SYSTEM

Old Password ••••

New Password •••

Confirm Password •••

له بەشی Old password پاسۆردە کۆنەکە دەنوسین

لەبەشی New password پاسۆردە نوێکە دەنووسین

لەبەشی Confirm Password پاسۆردە نوێکە دووبارە ئەنووسینەوە.

Administration

127.0.0.1:8080/apex/f?p=4500:3000:8846591714793::NO::&success_msg=Password%20changed.%2FCFCCE7509163833FF4DC6538181B0204%2F

ORACLE Database Express Edition

Home Logout Help

User: SYSTEM

Home > Administration

Password changed.

Storage Memory Database Users Monitor About Database

Tasks

- Change My Password
- Manage Login Message
- Manage HTTP Access

وەك لەوێنەکەدا دیارە کردارەکە بەسەرکەوتوی بە ئە نجام گەشتوە ئێستا ئەتوانیت تەنها بە پاسۆردە تازەکەت بچیتە ناو بەرنامەکەوە.

## دانانی نامەی ئاگادارکردنەوە یان نامەی بەخێرهاتن




کلیك لەو سێگۆشە بچوکەی بەشیAdministrationدەکەین ئەم لیستە دەکرێتەوە

پێویستە کلیك لە Manage Login Messageبکەین و ئەم ڕوکارە دەکرێتەوە



- No Message واتە هیچ نامەیەکی لەسەر شاشە پیشان نەدات
- Custom Message واتە دانانی نامەی ئاگادار کردنەوە یان بەخێرهاتن......
- تێبینی:ئەتوانین لەڕێگەی کۆد و تاگەکانی( HTML )ئەوەی ئەمانەوێت بینوسین وەك وێنەکە.

Application Express Login
127.0.0.1:8080/apex/f?p=4550:11:1933985218296771::NO:::
ORACLE Database Express Edition
Database Login
Enter your database username and password.
Username
Password
Login
Click here to learn how to get started

welcome to my database
user:system
password:sys
Language: en-us

<br>ئەم تاگە واتە بچۆ دێڕێکی تازە بۆ نوسینی داهاتوو ئەگەر بەکاری نەهێنین ئەوا هەموو

نووسینەکەمان بە یەك ڕیز بۆ ئەنوسێت وەك ئەم وێنەی خوارەوە

Application Express Login ×

127.0.0.1:8080/apex/f?p=4550:11:773004896757835::NO:::

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username

Password

Login

Click here to learn how to get started

welcome to my database user:system password:sys

ئەمەش دانانی نوسینی پێویست لەسەر شاشە بۆ بەکارهێنەرانی بەرنامەکەمان

## ئیشكردن لەناو بەرنامەی ئۆڕاكڵ

لە ناو بەرنامەی ئۆڕاكڵدا كۆمەڵێك خشتەی ئامادەكراو هەیە كەئەتوانین ئیشیان لەسەر بكەین و كردارەكان تاقی بكەینەوە,ئەمە سەرەڕای ئەوەی خۆمان ئەتوانین بە ویستی خۆمان خشتە دروست بكەین,لێرەدا وەك بەرچاو ڕوونیەك بۆ ئێوە پێش ئەوەی دەست بكەین بە دروستكردنی خشتە لەسەر خشتە ئامادەكراوەكان كۆمەڵێك كردار تاقی ئەكەینەوە لە دواتردا باسی دروستكردنی خشتە ئەكەین.



SQL select statement

## پیشاندانی هەموو داتاكانی خشتە



```
Select * from departments;
```

واتە هەموو داتاكانی خشتەی دیپارتمێنت پیشانبدە.

ئەگەر ویستمان تەنها چەند خانەیەكی پیشان بدات ئەوە لەبری * ناوی ئەو خانانە ئەنووسین.

User: HR

Home > SQL > SQL Commands

☑ Autocommit Display 10

```
select * from departments;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| DEPARTMENT_ID | DEPARTMENT_NAME | MANAGER_ID | LOCATION_ID |
|---|---|---|---|
| 10 | Administration | 200 | 1700 |
| 20 | Marketing | 201 | 1800 |
| 30 | Purchasing | 114 | 1700 |
| 40 | Human Resources | 203 | 2400 |
| 50 | Shipping | 121 | 1500 |
| 60 | IT | 103 | 1400 |
| 70 | Public Relations | 204 | 2700 |
| 80 | Sales | 145 | 2500 |
| 90 | Executive | 100 | 1700 |
| 100 | Finance | 108 | 1700 |

More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows.

10 rows returned in 0.09 seconds CSV Export

ئەگەر ویستمان چەند خانەیەکی وەربگرین بەم شێوەیە ئەبێت

User: HR

Home > SQL > SQL Commands

☑ Autocommit Display 10

```
select LOCATION_ID,DEPARTMENT_ID from departments;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LOCATION_ID | DEPARTMENT_ID |
| --- | --- |
| 1700 | 10 |
| 1800 | 20 |
| 1700 | 30 |
| 2400 | 40 |
| 1500 | 50 |
| 1400 | 60 |
| 2700 | 70 |
| 2500 | 80 |
| 1700 | 90 |
| 1700 | 100 |

More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows.

10 rows returned in 0.00 seconds CSV Export

# Arithmetic Expression

## کرداره حسابیەکان

**ئەگەر ویستمان یەکێك لە خانەکان لەگەڵ ژمارەیەك کۆبکەینەوە یان هەرکردارێکی تر ئەوا بەم شێوە ئەبێت**

**لەم وێنەیەدا ئەبینین خانەی دووەم ژمارە 300 بۆ زیاد کراوە بەم شێوەیە**

☑ Autocommit Display 10

```
select last_name,salary,salary+300 from employees;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY | SALARY+300 |
|---|---|---|
| King | 24000 | 24300 |
| Kochhar | 17000 | 17300 |
| De Haan | 17000 | 17300 |
| Hunold | 9000 | 9300 |

لەم وێنەیەدا 12 لێکدانی خانەی مووچە کراوە و لەگەڵ ژمارە 100 کۆکراوەتەوە

☑ Autocommit Display 10

```
select last_name,salary,12*salary+100 from employees;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY | 12*SALARY+100 |
|---|---|---|
| King | 24000 | 288100 |
| Kochhar | 17000 | 204100 |
| De Haan | 17000 | 204100 |

تێبینی:ئەبێت ئاگاداری ئەوەبین کە حسابی هەموو یاساکانی بیرکاری بکەین ئەگەر نا کردارەکە هەڵە ئەبێت وەك لەم وێنەیەدا دیارە تەنها بە دانانی کەوانەیەك ژمارەکان چۆن ئەگۆڕێت.

☑ Autocommit Display 10

```
select last_name,salary,12*(salary+100) from employees;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY | 12*(SALARY+100) |
|---|---|---|
| King | 24000 | 289200 |
| Kochhar | 17000 | 205200 |
| De Haan | 17000 | 205200 |

# NULL Value

## نرخی بەتاڵ

0 بەمانای نرخ دێت , سپەیس بەمانای پیت دێت

Null واتە نرخەکەی نەزانراو بێت یان نەیبێت

لەم وێنەیەدا ئەبینین هیچ نرخێك لە خانەکەدا نیە کە پێی دەوترێتNull

☑ Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,JOB_ID,SALARY,COMMISSION_PCT from employees;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID | SALARY | COMMISSION_PCT |
|---|---|---|---|
| King | AD_PRES | 24000 | - |
| Kochhar | AD_VP | 17000 | - |
| De Haan | AD_VP | 17000 | - |

وە پێویستە ئەوەش بزانین ئەگەر خانەیەکی بەتاڵ هەرکردارێکی لەسەر ئەنجام بەین هەر بە بەتاڵی ئەمێنێتەوە وەك لەم وێنەدا دەرئەکەوێت

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,JOB_ID,SALARY,12*SALARY*COMMISSION_PCT from employees;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID | SALARY | 12*SALARY*COMMISSION_PCT |
|---|---|---|---|
| King | AD_PRES | 24000 | - |
| Kochhar | AD_VP | 17000 | - |
| De Haan | AD_VP | 17000 | - |

# ALIAS

# ناوی خواستراو

ئەگەر ویستمان ناوی یەکێك لە خانەکان بگۆڕین ئەوا ئەتوانین بە شێوەیە ئەنجامی بدەین

Select LAST_NAME "name", SALARY*12 "annual salary" from employees

واتە ناوی لاست نەیم بگۆڕە بۆ "نەیم"و خانەی سالەری لێکدانی 12 بکەو ناوەکەی بیگۆڕە بۆ"موچەی سالآنە"

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME "name", SALARY*12 "annual salary" from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| Name | Annual Salary |
|---|---|
| King | 288000 |
| Kochhar | 204000 |
| De Haan | 204000 |

# تێکەڵ کردنی دوو خانە لە یەك خانەدا

لێرەدا ئەتوانین زانیارییەکانی چەند خانەیەك لەناو یەك خانەدا پیشان بدەین بەم شێوەیە

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME || JOB_ID "EMPLOYEES" from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEES |
| --- |
| KingAD_PRES |
| KochharAD_VP |
| De HaanAD_VP |

یاخود ئەتوانین نوسینێك لەنێوان زانیاری خانەکاندا دابنێین بەم شێوەیە

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME || ' is a ' || JOB_ID as "EMPLOYEES" from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEES |
| --- |
| King is a AD_PRES |
| Kochhar is a AD_VP |
| De Haan is a AD_VP |

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME || ' :1 Month Salary= ' ||SALARY monthly from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| MONTHLY |
| --- |
| King :1 Month Salary= 24000 |
| Kochhar :1 Month Salary= 17000 |
| De Haan :1 Month Salary= 17000 |

ئەتوانین بە چەند شێوەیەك ناوی خانەیەك بگۆڕین

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME || ' :1 Month Salary= ' ||SALARY    monthly   from employees
select LAST_NAME || ' :1 Month Salary= ' ||SALARY   "monthly" from employees
select LAST_NAME || ' :1 Month Salary= ' ||SALARY as "monthly" from employees
```

## چارەسەرکردنی زانیاری دووبارە بووەوە

ئەگەر سەیری ئەم وێنەی خوارەوە بکەین ئەبینین زیاد لە جارێك زانیاری دووبارەی تیایە ئەوا بۆ چارەسەر کردنی ئەتوانین ئەم ڕێگایانە بەکاربێنین

Autocommit Display 10

```
select DEPARTMENT_ID from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| DEPARTMENT_ID |
|---|
| 90 |
| 90 |
| 90 |
| 60 |
| 60 |
| 60 |
| 60 |
| 60 |
| 100 |
| 100 |
| More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows. |

## بەکارهێنانی DISTINCT

وەك لە وێنەکەدا دیارە ئەبینین زانیارییە دوبارەکان نامێنێت

Autocommit Display 10

```
select distinct DEPARTMENT_ID from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| DEPARTMENT_ID |
|---|
| 100 |
| 30 |
| - |
| 90 |
| 20 |
| 70 |
| 110 |
| 50 |
| 80 |
| 40 |
| More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows. |

هەروەها ئەتوانین بە زیاد لە خانەیەك وابكەین كە زانیاری دووبارە نەمێنێت

☑ Autocommit Display 10

```
select distinct DEPARTMENT_ID,JOB_ID from employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| DEPARTMENT_ID | JOB_ID |
|---|---|
| 110 | AC_ACCOUNT |
| 90 | AD_VP |
| 50 | ST_CLERK |
| 80 | SA_REP |
| 50 | ST_MAN |
| 80 | SA_MAN |
| 110 | AC_MGR |
| 90 | AD_PRES |
| 60 | IT_PROG |
| 100 | FI_MGR |

More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows.

DESCRIBE

## پێكهاتە( تایبە تمەندی )

بۆ پیشاندانی تایبە تمەندییەكانی خشتەیەك لە ڕووی جۆری داتا و قەبارە و....هتد.

DESC table name

Autocommit Display 10 Save Run

```
DESC employees
```

Results Explain Describe Saved SQL History

Object Type TABLE Object EMPLOYEES

| Table | Column | Data Type | Length | Precision | Scale | Primary Key | Nullable | Default | Comment |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| EMPLOYEES | EMPLOYEE_ID | Number | - | 6 | 0 | 1 | - | - | Primary key of employees table. |
| | FIRST_NAME | Varchar2 | 20 | - | - | - | ✓ | - | First name of the employee. A not null column. |
| | LAST_NAME | Varchar2 | 25 | - | - | - | - | - | Last name of the employee. A not null column. |
| | EMAIL | Varchar2 | 25 | - | - | - | - | - | Email id of the employee |
| | PHONE_NUMBER | Varchar2 | 20 | - | - | - | ✓ | - | Phone number of the employee; includes country code and area code |
| | HIRE_DATE | Date | 7 | - | - | - | - | - | Date when the employee started on this job. A not null column. |
| | JOB_ID | Varchar2 | 10 | - | - | - | - | - | Current job of the employee; foreign key to job_id column of the jobs table. A not null column. |
| | SALARY | Number | - | 8 | 2 | - | ✓ | - | Monthly salary of the employee. Must be greater than zero (enforced by constraint emp_salary_min) |
| | COMMISSION_PCT | Number | - | 2 | 2 | - | ✓ | - | Commission percentage of the employee; Only employees in sales department elgible for commission percentage |
| | MANAGER_ID | Number | - | 6 | 0 | - | ✓ | - | Manager id of the employee; has same domain as manager_id in departments table. Foreign key to employee_id column of employees table. (useful for reflexive joins and CONNECT BY query) |
| | DEPARTMENT_ID | Number | - | 4 | 0 | - | ✓ | - | Department id where employee works; foreign key to department_id column of the departments table |

1 - 11

Select * from tab

بۆ پیشاندانی هەموو خشتە دروستکراوەکان

Autocommit Display 10

```
select * from tab
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| TNAME | TABTYPE | CLUSTERID |
|---|---|---|
| REGIONS | TABLE | - |
| COUNTRIES | TABLE | - |
| LOCATIONS | TABLE | - |
| DEPARTMENTS | TABLE | - |
| JOBS | TABLE | - |
| EMPLOYEES | TABLE | - |
| JOB_HISTORY | TABLE | - |
| EMP_DETAILS_VIEW | VIEW | - |
| E | SYNONYM | - |
| STUDENT | TABLE | - |

More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows.

10 rows returned in 0.06 seconds CSV Export

# Select with where Statement

## پیشاندانی زانیارییەکان بە بوونی مەرجێك

☑ Autocommit Display 10

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,DEPARTMENT_ID from EMPLOYEES
Where DEPARTMENT_ID =90
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | DEPARTMENT_ID |
|---|---|---|---|
| 100 | King | AD_PRES | 90 |
| 101 | Kochhar | AD_VP | 90 |
| 102 | De Haan | AD_VP | 90 |

3 rows returned in 0.05 seconds CSV Export

لەم مەرجەدا کە زانیاری ناو خانەکان کراوەتە مەرج پێویستە ڕەچاوی سمۆڵ و کە پیتەڵی پیتەکان بکەین

Autocommit Display 10

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,DEPARTMENT_ID from EMPLOYEES
Where JOB_ID='SA_REP'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | DEPARTMENT_ID |
|---|---|---|---|
| 150 | Tucker | SA_REP | 80 |
| 151 | Bernstein | SA_REP | 80 |
| 152 | Hall | SA_REP | 80 |
| 153 | Olsen | SA_REP | 80 |
| 154 | Cambrault | SA_REP | 80 |
| 155 | Tuvault | SA_REP | 80 |
| 156 | King | SA_REP | 80 |
| 157 | Sully | SA_REP | 80 |
| 158 | McEwen | SA_REP | 80 |
| 159 | Smith | SA_REP | 80 |

More than 10 rows available. Increase rows selector to view more rows.

10 rows returned in 0.00 seconds CSV Export

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 10

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,DEPARTMENT_ID from EMPLOYEES
Where LAST_NAME='WHALEN'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

no data found

# COMPARISON PARAMETERS

## بەراوردكردن

لەم وێنەیەدا مەرجی ئەوە دانراوە كە مووچە بچوكتر و یەكسان بێت بە 3000

☑ Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,salary from EMPLOYEES
Where salary<=3000
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY |
|---|---|
| Baida | 2900 |
| Tobias | 2800 |
| Himuro | 2600 |
| Colmenares | 2500 |
| Mikkilineni | 2700 |

لەم وێنەیەدا داوای ئەو ژمارانە ئەكات كە ئەكەونە نێوان 2500تا 3500

```
select LAST_NAME,salary from EMPLOYEES
Where salary between 2500 and 3500
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY |
|---|---|
| Khoo | 3100 |
| Baida | 2900 |
| Tobias | 2800 |
| Himuro | 2600 |

وە ئەتوانین بە شێوەیەش بینووسین

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,salary from EMPLOYEES
Where salary>=2500 and salary<=3500
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY |
|---|---|
| Khoo | 3100 |
| Baida | 2900 |
| Tobias | 2800 |
| Himuro | 2600 |
| Colmenares | 2500 |

لەم مەرجەدا ئەڵێت ئەو ژمارانەی لەناو کەوانەکەدایە ئەگەر هەبوو پیشانی بدە

Autocommit Display 10

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,SALARY,MANAGER_ID from EMPLOYEES
Where MANAGER_ID in(100,101,102)
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | SALARY | MANAGER_ID |
|---|---|---|---|
| 101 | Kochhar | 17000 | 100 |
| 102 | De Haan | 17000 | 100 |
| 114 | Raphaely | 11000 | 100 |
| 120 | Weiss | 8000 | 100 |

ئەتوانین بەم شێوەیەش هەمان کۆدی سەرەوە بنوسین

Autocommit Display 50

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,SALARY,MANAGER_ID from EMPLOYEES
Where MANAGER_ID=101 or MANAGER_ID=102 or MANAGER_ID=103
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | SALARY | MANAGER_ID |
|---|---|---|---|
| 108 | Greenberg | 12000 | 101 |
| 200 | Whalen | 4400 | 101 |
| 203 | Mavris | 6500 | 101 |
| 204 | Baer | 10000 | 101 |
| 205 | Higgins | 12000 | 101 |
| 103 | Hunold | 9000 | 102 |
| 104 | Ernst | 6000 | 103 |
| 105 | Austin | 4800 | 103 |
| 106 | Pataballa | 4800 | 103 |
| 107 | Lorentz | 4200 | 103 |

وه هەروەها ئەتوانین بۆ ناویش ئەو مەرجە دابنێین

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 50

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,SALARY,MANAGER_ID from EMPLOYEES
Where LAST_NAME in('Hartstein','Vargas')
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | SALARY | MANAGER_ID |
|---|---|---|---|
| 201 | Hartstein | 13000 | 100 |
| 144 | Vargas | 2500 | 124 |

**لەم نموونەیەدا ئەڵێت ئەگەر یەکەم پیتی بە S دەستی پێکردبوو پیشانی بدە, پێویستە ڕەچاوی پیتی سمۆڵ و کە پیتەڵ بکەین**

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 50

```
select FIRST_NAME from EMPLOYEES
Where FIRST_NAME like 's%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

no data found

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 50

```
select FIRST_NAME from EMPLOYEES
Where FIRST_NAME like 'S%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME |
| --- |
| Sundar |
| Shelli |
| Sarah |
| Shelley |
| Steven |

**لەم نموونەیەدا ئەگەر مەرجەکە لە کۆتاییەوە بوو پیشانی بدە**

Autocommit Display 50

```
select FIRST_NAME,HIRE_DATE from EMPLOYEES
Where HIRE_DATE like'%95'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME | HIRE_DATE |
| --- | --- |
| Alexander | 18-MAY-95 |
| Payam | 01-MAY-95 |
| Renske | 14-JUL-95 |
| Trenna | 17-OCT-95 |

4 rows returned in 0.01 seconds CSV Export

**لەم نموونەیەدا ئەگەر مەرجەکە هەبوو لە هەر شوێنێکدا پیشانی بدە**

Autocommit Display 50

```
select LAST_NAME from EMPLOYEES
Where LAST_NAME like '_o%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME |
|---|
| Colmenares |
| Doran |
| Fox |

Autocommit Display 50

```
select LAST_NAME,JOB_ID from EMPLOYEES
Where JOB_ID like '%SA_%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID |
|---|---|
| Russell | SA_MAN |
| Partners | SA_MAN |
| Errazuriz | SA_MAN |

Home > SQL > SQL Commands

Autocommit Display 50

```
select LAST_NAME,MANAGER_ID from EMPLOYEES
Where  MANAGER_ID is null
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | MANAGER_ID |
|---|---|
| King | - |

1 rows returned in 0.00 seconds CSV Export

Autocommit Display 50

```
select LAST_NAME,JOB_ID,COMMISSION_PCT from EMPLOYEES
Where COMMISSION_PCT is null
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID | COMMISSION_PCT |
|---|---|---|
| King | AD_PRES | - |
| Kochhar | AD_VP | - |
| De Haan | AD_VP | - |
| Hunold | IT_PROG | - |

لەم نموونەیەدا پێویستە ئەوانە پیشان بات کە مووچەیان لە 10000 و زیاترە وەهەروەها job_id ی وشەی man تیادا بێت.

Autocommit Display 50

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,SALARY from EMPLOYEES
Where SALARY>=10000 and JOB_ID like '%MAN%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | SALARY |
|---|---|---|---|
| 114 | Raphaely | PU_MAN | 11000 |
| 145 | Russell | SA_MAN | 14000 |
| 146 | Partners | SA_MAN | 13500 |
| 147 | Errazuriz | SA_MAN | 12000 |
| 148 | Cambrault | SA_MAN | 11000 |

لەم نموونەیەدا پێویستە ئەوانە پیشان بات کە مووچەیان لە 10000 و زیاترە یان job_id ی وشەی man تیادا بێت.

Autocommit Display 50

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,SALARY from EMPLOYEES
Where SALARY>=10000 or JOB_ID like '%MAN%'
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | SALARY |
|---|---|---|---|
| 100 | King | AD_PRES | 24000 |
| 101 | Kochhar | AD_VP | 17000 |
| 102 | De Haan | AD_VP | 17000 |
| 108 | Greenberg | FI_MGR | 12000 |
| 114 | Raphaely | PU_MAN | 11000 |

لەم نموونەیەدا پێویستە job_id وشەی (it_prog) تیا نەبێت

Autocommit Display 50

```
select LAST_NAME,JOB_ID from EMPLOYEES
Where JOB_ID NOT In('IT_PROG')
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID |
|---|---|
| King | AD_PRES |
| Kochhar | AD_VP |
| De Haan | AD_VP |
| Greenberg | FI_MGR |
| Faviet | FI_ACCOUNT |

ئەمەش نموونەی تێکەڵکردنی OR و AND بەیەکەوە

The following table shows the results of combining two expressions with AND:

| AND | TRUE | FALSE | NULL |
|---|---|---|---|
| TRUE | TRUE | FALSE | NULL |
| FALSE | FALSE | FALSE | FALSE |
| NULL | NULL | FALSE | NULL |

The following table shows the results of combining two expressions with OR:

| OR | TRUE | FALSE | NULL |
|---|---|---|---|
| TRUE | TRUE | TRUE | TRUE |
| FALSE | TRUE | FALSE | NULL |
| NULL | TRUE | NULL | NULL |

The following table shows the result of applying the NOT operator to a condition:

| NOT | TRUE | FALSE | NULL |
|---|---|---|---|
| | FALSE | TRUE | NULL |

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,SALARY from EMPLOYEES
Where JOB_ID='SA_REP' or JOB_ID='SA_PRES' and SALARY>1500
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | SALARY |
|---|---|---|---|
| 150 | Tucker | SA_REP | 10000 |
| 151 | Bernstein | SA_REP | 9500 |
| 152 | Hall | SA_REP | 9000 |
| 153 | Olsen | SA_REP | 8000 |

Home > SQL > SQL Commands

☑ Autocommit Display 10

```
select EMPLOYEE_ID,LAST_NAME,JOB_ID,SALARY from EMPLOYEES
Where (JOB_ID='SA_REP' or JOB_ID='AD_PRES') and SALARY>15000
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | JOB_ID | SALARY |
|---|---|---|---|
| 100 | King | AD_PRES | 24000 |

1 rows returned in 0.00 seconds CSV Export

# ORDER BY

# ڕیزکردن

دوو جۆر ڕیزکردن هەیە :

*لە گەورەوە بۆ بچووکDESC *لە بچووکەوە بۆ گەورەASC,ئەگەر هیچ نەنوسرابوو واتە لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزی بکە :

☑ Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,JOB_ID,DEPARTMENT_ID,HIRE_DATE from EMPLOYEES
ORDER by HIRE_DATE
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID | DEPARTMENT_ID | HIRE_DATE |
|---|---|---|---|
| King | AD_PRES | 90 | 17-JUN-87 |
| Whalen | AD_ASST | 10 | 17-SEP-87 |
| Kochhar | AD_VP | 90 | 21-SEP-89 |
| Hunold | IT_PROG | 60 | 03-JAN-90 |

## له گەورەوە بۆ بچووك ڕیزی بکە

☑ Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,JOB_ID,DEPARTMENT_ID,HIRE_DATE from EMPLOYEES
ORDER by HIRE_DATE DESC
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | JOB_ID | DEPARTMENT_ID | HIRE_DATE |
|---|---|---|---|
| Kumar | SA_REP | 80 | 21-APR-00 |
| Banda | SA_REP | 80 | 21-APR-00 |
| Ande | SA_REP | 80 | 24-MAR-00 |
| Markle | ST_CLERK | 50 | 08-MAR-00 |



**ئەو ژمارەیە مەبەستی ئەوەیە بە پێی خانەی دووەم لە گەورەوە بۆ بچووك**

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,SALARY from EMPLOYEES
ORDER by 2 DESC
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | SALARY |
|---|---|
| King | 24000 |
| Kochhar | 17000 |
| De Haan | 17000 |
| Russell | 14000 |

```
select EMPLOYEE_ID, LAST_NAME,SALARY*12 as annual from EMPLOYEES
ORDER by annual
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| EMPLOYEE_ID | LAST_NAME | ANNUAL |
|---|---|---|
| 132 | Olson | 25200 |
| 128 | Markle | 26400 |
| 136 | Philtanker | 26400 |
| 135 | Gee | 28800 |
| 127 | Landry | 28800 |

# Character Functions



# Case-Manipulation Functions

These functions convert case for character strings:

| Function | Result |
|---|---|
| LOWER('SQL Course') | sql course |
| UPPER('SQL Course') | SQL COURSE |
| INITCAP('SQL Course') | Sql Course |

# Character-Manipulation Functions

These functions manipulate character strings:

| Function | Result |
|---|---|
| CONCAT('Hello', 'World') | HelloWorld |
| SUBSTR('HelloWorld',1,5) | Hello |
| LENGTH('HelloWorld') | 10 |
| INSTR('HelloWorld', 'W') | 6 |
| LPAD(salary,10,'*') | *****24000 |
| RPAD(salary, 10, '*') | 24000***** |
| REPLACE ('JACK and JUE','J','BL') | BLACK and BLUE |
| TRIM('H' FROM 'HelloWorld') | elloWorld |

ORACLE

## LOWER هەموو پیتەکان ئەکات بە سموڵ

☑ Autocommit Display 10

```
select FIRST_NAME,LAST_NAME,LOWER(LAST_NAME) name from EMPLOYEES
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME | LAST_NAME | NAME |
|---|---|---|
| Ellen | Abel | abel |
| Sundar | Ande | ande |
| Mozhe | Atkinson | atkinson |
| David | Austin | austin |
| Hermann | Baer | baer |

## UPPER هەموو پیتەکان ئەکات بە کەپیتەڵ

☑ Autocommit Display 10

```
select FIRST_NAME,LAST_NAME,UPPER(LAST_NAME) name from EMPLOYEES
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME | LAST_NAME | NAME |
|---|---|---|
| Ellen | Abel | ABEL |
| Sundar | Ande | ANDE |
| Mozhe | Atkinson | ATKINSON |
| David | Austin | AUSTIN |
| Hermann | Baer | BAER |

## INITCAP یەکەم پیتی ئەکات بە کە پیتەڵ

Autocommit Display 10

```
select name , initcap(name) from e
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| NAME | INITCAP(NAME) |
|---|---|
| sarkawt | Sarkawt |
| sardar | Sardar |
| sarawan | Sarawan |
| sawen | Sawen |
| swma | Swma |

## CONCAT بۆ تێکەڵکردنی 2 خانە یان زیاتر

Autocommit Display 10

```
select FIRST_NAME,LAST_NAME,CONCAT(FIRST_NAME,LAST_NAME) NAME  from EMPLOYEES
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME | LAST_NAME | NAME |
|---|---|---|
| Ellen | Abel | EllenAbel |
| Sundar | Ande | SundarAnde |
| Mozhe | Atkinson | MozheAtkinson |
| David | Austin | DavidAustin |
| Hermann | Baer | HermannBaer |
| Shelli | Baida | ShelliBaida |

**LENGTH پیشاندانی ژمارەی پیتەکانی ووشەکە**

**INSTR پیتێك دیاری ئەکەیت بزانی ئەگەر لە وشەکەدا هەبوو چەنەم پیتی وشەکەیە**

**SUBSTR بۆ نمونە بتەوێت لە پیتی 2 تاوەکو پیتی 7 بنوسێت بەم کردارە ئەیکەیت**

☑ Autocommit Display 10

```
select FIRST_NAME,LAST_NAME,CONCAT(FIRST_NAME,LAST_NAME) NAME ,
LENGTH(LAST_NAME),
INSTR(LAST_NAME , 'A'),
SUBSTR(LAST_NAME,1,4)
from EMPLOYEES
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| FIRST_NAME | LAST_NAME | NAME | LENGTH(LAST_NAME) | INSTR(LAST_NAME,'A') | SUBSTR(LAST_NAME,1,4) |
|---|---|---|---|---|---|
| Ellen | Abel | EllenAbel | 4 | 1 | Abel |
| Sundar | Ande | SundarAnde | 4 | 1 | Ande |
| Mozhe | Atkinson | MozheAtkinson | 8 | 1 | Atki |
| David | Austin | DavidAustin | 6 | 1 | Aust |
| Hermann | Baer | HermannBaer | 4 | 0 | Baer |
| Shelli | Baida | ShelliBaida | 5 | 0 | Baid |
| Amit | Banda | AmitBanda | 5 | 0 | Band |
| Elizabeth | Bates | ElizabethBates | 5 | 0 | Bate |
| Sarah | Bell | SarahBell | 4 | 0 | Bell |
| David | Bernstein | DavidBernstein | 9 | 0 | Bern |

REPLACE بۆ گۆڕینی وشەیەك بە وشەیەكی تر

☑ Autocommit Display 10

```
select replace(name,'s','C') from e
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| REPLACE(NAME,'S','C') |
|---|
| Carkawt |
| Cardar |
| Carawan |
| Cawen |
| Cwma |

بۆ لابردنی پیتێك له وشەكەدا TRIM

بۆ نمونه ئەتەوێت 10 پیت بنوسێت ئەوا لەلای چەپەوە * زیاد ئەكات تاوەكە 10 پیتەكە. LPAD

بۆ نمونه ئەتەوێت 10 پیت بنوسێت ئەوا لەلای ڕاستەوە * زیاد ئەكات تاوەكە 10 پیتەكە. RPAD

Autocommit Display 10

```
select LAST_NAME,
TRIM( 'A' from LAST_NAME),
LPAD(LAST_NAME ,10,'*'),
RPAD(LAST_NAME,10,'*')
from EMPLOYEES
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| LAST_NAME | TRIM('A'FROMLAST_NAME) | LPAD(LAST_NAME,10,'*') | RPAD(LAST_NAME,10,'*') |
|---|---|---|---|
| Abel | bel | ******Abel | Abel****** |
| Ande | nde | ******Ande | Ande****** |
| Atkinson | tkinson | **Atkinson | Atkinson** |
| Austin | ustin | ****Austin | Austin**** |
| Baer | Baer | ******Baer | Baer****** |
| Baida | Baida | *****Baida | Baida***** |

# Number Functions

- ROUND: Rounds value to specified decimal
- TRUNC: Truncates value to specified decimal
- MOD: Returns remainder of division

| Function | Result |
| --- | --- |
| ROUND(45.926, 2) | 45.93 |
| TRUNC(45.926, 2) | 45.92 |
| MOD(1600, 300) | 100 |

ORACLE

ROUNDواتە نزیکردنەوەی ژمارەکە بۆ کردارە بیرکارییەکان ئەگەر هاتوو ژمارەکە لە 5 گەورەتر بوو ئەوا زیادی ئەکا

بەلاَم لە TRUNC بە پێچەوانەوە کاردەکات ئەگەر ژمارەکە لە 5 گەورەتر بوو کەمی ئەکاتەوە.

MOD کاتێ دوو ژمارە دابەشی یەکتر ئەکەی چەنی ئەمێنێتەوە ئەم کردارە ئەوە پیشان ئەیات ئەگەر سفریش بێت.

*لەم نمونەیەدا لە بەشی یەکەمی ئەڵێت 2 خانە بهێڵەوە لە دووای فاریزەوە حسابی خانەی سێهەم ئەکات ئەگەر لە 5 زیاتر بوو ئەوا ژمارەکە زیاد ئەکات.

* بەشی دووەم ئەڵێت با فاریزە نەبێت وەك ئەبینین 923 لە 500 زیاترە ئەوا 45 ئەکات بە 46.

*لەبەشی سێهەم ئەڵێت حسابی خانەیەك ئەو دیوو فاریزە بکە,کە 5.923 لە 5 زیاترە ئەوا 45 ئەبێت بە 50.

☑ Autocommit Display 10

```
select ROUND(45.923,2), ROUND(45.923,0), ROUND(45.923,-1)
from DUAL;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| ROUND(45.923,2) | ROUND(45.923,0) | ROUND(45.923,-1) |
|---|---|---|
| 45.92 | 46 | 50 |

1 rows returned in 0.00 seconds CSV Export

☑ Autocommit Display 10

```
select TRUNC(45.923,2), TRUNC(45.923,0), TRUNC(45.923,-1)
from DUAL;
```

Results Explain Describe Saved SQL History

| TRUNC(45.923,2) | TRUNC(45.923,0) | TRUNC(45.923,-1) |
|---|---|---|
| 45.92 | 45 | 40 |

1 rows returned in 0.01 seconds CSV Export

## چۆن یوزەرێکی تازە دروست بکەین بۆ بەرنامەکە

سەرەتا بەرنامەکە ئەکەینەوە لە ڕێگەی یوزەری ( System )چونکە ڕێپێدراوە بۆ ئەو کارە.




پاشان یەک کلیك لە بەشیAdministrationدەکەین ئەم بەشە دەکرێتەوە




Create Userبۆ دروست کردنی یوزەری تازە.

Manage usersبۆ گۆڕانکاری لە یوزەرەکاندا

ئێمە لێرەدا بەشی یەکەم هەڵدەبژێرین.......................ئەم فۆرمە دەکرێتەوە

Home > Administration > Manage Database Users > Create Database User

Create Database User — Cancel — Create

* Username: sarkawt
* Password: ····
* Confirm Password: ····
Expire Password
Account Status: Unlocked
Default Tablespace: USERS
Temporary Tablespace: TEMP

User Privileges

Roles:
☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Direct Grant System Privileges:
☐ CREATE DATABASE LINK ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW ☐ CREATE PROCEDURE
☐ CREATE PUBLIC SYNONYM ☐ CREATE ROLE ☐ CREATE SEQUENCE
☐ CREATE SYNONYM ☑ CREATE TABLE ☐ CREATE TRIGGER
☐ CREATE TYPE ☑ CREATE VIEW

Check All Uncheck All

1-ناوی یوزەرەکە ئەنووسین

2-پاسۆردی داخڵ بوون ئەنووسین. 3-پاسۆردەکە دوبارە ئەنوسینەوە.

4-واتە لەکاتی داخڵ بوندا پاسۆرد ئەگۆڕیت, پێویست ناکات چالاکی کەین گرنگ نیە.

5-لێرەدا داوای ئەوە دەکات یوزەرەکە (کراوە بێت)واتە ئیشی پێ ئەکەیت یاخود (داخراو بێت)تەنها بۆ دروست کردن .بەئارەزوی خۆت,بەلاَم با کراوە بێت.

وەلە بەشی خوارەوەیدا ئەو دەسەلاَتانەی بۆ دیاری ئەکەین کە بتوانێت چی بکات وەك لە وێنەکەدا دیارە بە پێی پێویست. پاشان دروستی ئەکەین

Home > Administration > Manage Database Users

User Created.

Search Username — View: Icons — Show: Database Users — Display: 15 — Go — Create >

123SA HR SARKAWT

1-3

ئێستا ئەتوانین لەرێگەی یوزەرە تازەکەوە داخلی بەرنامەکە ببین بەم شێوەیە

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username sarkawt

Password ••••

Login

Click here to learn how to get started

بەم شێوەیە دەبینین داخڵ بووین و دەتوانین ئەو کارانە بکەین کە ڕێگە پێ دراوین



## گۆڕانكاری كردن له‌ فۆڕمی یوزه‌ردا

سه‌ره‌تا له‌ڕێگه‌ی یوزه‌ری System داخڵی به‌رنامه‌كه‌ ده‌بین

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username system

Password •••

Login

Click here to learn how to get started

پاشان كلیك له‌ به‌شی Administration ده‌كه‌ین

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home

Administration Object Browser SQL Utilities

click

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration

Storage Memory tor About Database

Database Users

Create User

Manage Users

به‌شی Database user ده‌كه‌ینه‌وه‌و Manage users هه‌ڵده‌بژێرین




دواتر ئەوUser دیاری دەکەین کە دەمانەوێت گۆڕانکاری تیابکەین

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users > User

Manage Database User — Cancel | Drop | Alter User

Username SARKAWT
Password
Confirm Password
Expire Password ☑
Account Status Unlocked
Default Tablespace: USERS
Temporary Tablespace: TEMP

User Privileges

Roles:
☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Directly Granted System Privileges:
☐ CREATE DATABASE LINK ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW ☐ CREATE PROCEDURE
☐ CREATE PUBLIC SYNONYM ☐ CREATE ROLE ☐ CREATE SEQUENCE
☐ CREATE SYNONYM ☑ CREATE TABLE ☐ CREATE TRIGGER
☐ CREATE TYPE ☑ CREATE VIEW

Check All Uncheck All

All System Privileges Granted to SARKAWT

لێرەدا هەرگۆڕانکاریەك دەكەین كە بمانەوێت بۆ نموونە

لێرەدا بەشیExpire password چالاك دەكەین بۆ گۆڕینی پاسۆرد دوای داخڵ بوون

پاشان كليك له Alter User دەكەين




لێرەدا دەردەكەوێت كە گۆڕنكارییەكە سەركەوتوبووە ,لەبەرنامەكە دەردەچین.

پێویستە بچینەوە ناو بەرنامەكە بەلام ئەم جارە بەو یوزەرەی گۆڕان كارییەكا نمان بۆ كردوە

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username sarkawt

Password ••••

Login

Click here to learn how to get started

لێرەدا دەبینین داوای گۆڕینی پاسۆردی یوزەرەكە دەكات وەك ئەوەی دیاری مان كرد.

ORACLE Database Express Edition

Change Password Cancel Apply Changes

The account password has expired and must be changed.

User Name **sarkawt**

Old Password

New Password

Confirm Password

دوای گۆڕینی پاسۆردەکە بە سەرکەوتووی ئەم فۆڕمە دێتە سەر شاشەکە.




&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&&

گۆڕانکارییەکە تر Locked واتە یوزەرەکە نەتوانێ داخلی بەرنامەکە بێت







لێرەدا دەبینین ڕێگە بەداخڵ بونی یوزەرەکە نادات چونکە( لۆکید ) کراوە.

بۆ ئەوەی بتوانێ داخڵ بێتەوە پێویستە Unlocked بکرێت.

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users > User

Manage Database User Cancel Drop Alter User

Username SARKAWT

Password

Confirm Password

Expire Password

Account Status Unlocked

Default Tablespace: USERS

Temporary Tablespace: TEMP

پاشان دەبینین کە قفڵەکەی لەسەر نەماوەو ئەتوانین لەڕێگەیەوە داخلْ بین

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users



User Altered.

Search Username View Icons Show Database Users Display 15 Go Create >



HR



SARKAWT

1-2

ئەمەش گۆڕانكارى كردن لە فۆڕمى يوزەردا هيوادارم سودى هەبێت

## چۆنیەتی سڕینەوەی یوزەر

سەرەتا بەرنامەکە ئەکەینەوە لە ڕێگەی یوزەری ( System )چونکە ڕێپێدراوە بۆ ئەو کارە.

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username system

Password •••

Login

Click here to learn how to get started

پاشان یەك كلیك لە بەشیAdministrationدەکەین ئەم بەشە دەکرێتەوە

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home

Administration Object Browser SQL Utilities

click

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration

Storage Memory Database Users tor About Database

Create User

Manage Users

بەشی Database user دەکەینەوەو Manage usersهەڵدەبژێرین

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users

Search Username [ ] View [Icons] Show [Database Users] Display [15] Go Create >


HAMA


HR


SARKAWT

1-3

ئەو یوزەرە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێت بیسڕینەوە

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users > User

Manage Database User — Cancel | Drop | Alter User

Username **HAMA**
Password [ ]
Confirm Password [ ]
**Password Expired**
Account Status [Unlocked]
Default Tablespace: **USERS**
Temporary Tablespace: **TEMP**

كليك لەبەشی Dropدەكەین بۆ سڕینەوەی یوزەری Hama

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users > User > Confirm Drop User

Drop Database User — Cancel | Drop User

Please confirm your request.

Drop User: **HAMA**
Cascade [ ]

پاشان كليك لەDrop User بۆ تەواو سڕینەوەی یوزەرەكە




ئێستا لەوێنەکەدا دیارە کە یوزەرەکەمان سڕاوەتەوە.................

@@@@@@@@@ @@@@@@ @@@@@@@

## ڕێگەدان بە یوزەر کەبتوانێت چی کارێك بکات

سەرەتا لە ڕێگەی یوزەریSystem داخلی بەرنامەکە دەبین

دواتر کلیك لە بەشی Administration دەکەین وەك وێنەکە




دواتر لە بەشیDatabase usersدا دوو ڕێگا هەیە ,درووستکردنی یوزەر ,گۆڕانکاری یوزەر

لێرەدا ئێمە بەشی دووەم هەڵدەبژێرین لە بەر ئەوەی پێشتر یوزەرمان دروست کرد




لێرەدا ئەو یوزەرە دیاری دەکەین کە ئەرکی بۆ دیاری دەکەین,وەك وێنەکە

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users

Search Username View Icons Show Database Users Display 15 Go Create >



HR



SARKAWT

1-2

کلیك لە یوزەرەکە دەکەین ئەم ڕوکارە دەکرێتەوە

ORACLE Database Express Edition

User: SYSTEM

Home > Administration > Manage Database Users > User

Manage Database User — Cancel | Drop | Alter User

Username SARKAWT
Password
Confirm Password
Expire Password
Account Status Unlocked
Default Tablespace: USERS
Temporary Tablespace: TEMP

User Privileges

Roles:
CONNECT RESOURCE DBA

Directly Granted System Privileges:
CREATE DATABASE LINK, CREATE MATERIALIZED VIEW, CREATE PROCEDURE
CREATE PUBLIC SYNONYM, CREATE ROLE, CREATE SEQUENCE
CREATE SYNONYM, CREATE TABLE, CREATE TRIGGER
CREATE TYPE, CREATE VIEW

Check All Uncheck All

All System Privileges Granted to SARKAWT

وەك لە بەشی دوومی وێنەكەدا دیارە ئەو كردارانەی ئەمانەوێت یوزەرەكە بتوانێت بیكات بۆی دیاری دەكەین و سەحی لێدەدەین, ئەم وێنە یە بۆ یوزەرێكە پێشتر دروست كراوە,بەلآم ئەگەر یوزەری دروستكراو نەبوو هەر لەگەڵ دروست كردنەكەیدا كردارەكانی بۆ دیاری دەكەین , پێشتر چۆنیەتی دروستكردنی یوزەرمان باسكردوە.

ت:لە كاتێكدا ویستمان شتێك دروست كەین كە رێگەمان پێ نەدراوە ئەم نوسینەمان پیشاندەدات كە ئاماژەیە بەوەی ناتوانیت ئە نجامی بدەیت.....

## دروستكردنی تەیبڵ لە ڕێگای ویزاردەوە

سەرەتا لە ڕێگای یوزەرێکی ڕێپێدراو بۆ دروستکرنی تەیبڵ داخڵی بەرنامەکە دەبین

ORACLE Database Express Edition

Database Login

Enter your database username and password.

Username sarkawt

Password ••••

Login

Click here to learn how to get started

لەبەشی Object Browserکلیك لە بەشی createدەکەین و Tableدیاری دەکەین وەك لە وێنەکەدا...




وەك لە وێنەکەدا دیارە ئەم خشتەیە دەکرێتەوە:

ORACLE Database Express Edition

User: SARKAWT

Home > Object Browser

Table

Columns → Primary Key → Foreign Key → Constraints → Confirm

Create Table    Cancel    Next >

* Table Name student    Preserve Case

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
|---|---|---|---|---|---|
| sid | NUMBER | 1 | 50 | ✓ | ▼▲ |
| sname | VARCHAR2 | | 25 | | ▼▲ |
| age | NUMBER | 15 | 33 | | ▼▲ |
| address | VARCHAR2 | | 25 | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

Add Column

كليك له Nextدەكەين

ORACLE Database Express Edition

User: SARKAWT

Home > Object Browser

Table

Columns → Primary Key → Foreign Key → Constraints → Confirm

Primary Key    Cancel    < Previous    Next >

Table name: STUDENT

Primary Key:
- No Primary Key
- Populated from a new sequence
- Populated from an existing sequence
- Not populated

* Primary Key Constraint Name STUDENT_PK

* Sequence Name STUDENT_SEQ

* Primary Key SID(NUMBER)

كليك لهNextدەكەين

